

# تەجويد

بەکورتی و پوختی فێرە
تەجویدبە
دوعای ئەوەمان بۆ بکەن کە
الله لێمان رازی بێ 🤲☝️

**پیتەکانی زمانی عرەبی**

**ا ، ء ، ب، ت، ث، ج، ح، خ، د، ذ، ر، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ع، غ،**
**ف، ق، ك، ل، م، ن، هـ، و، ي**

# بەشی یەکەم

# مخارج الحروف

**(شوێنی دەرچونی پیتەکان)**

**گەر بتەوێ شوێنی دەرچونی هەر پیتێك ئاشكرا بكەی هەمزەیەکی فەتحەدار لە پێش پیتەکە دابنێ (أَ) نم / أَع یان أَخ**

پێنج شوێنمان هەیە کە پیتەکانی لێوە دەرئەچێ

١- الجوف (بۆشایی ناو دەم )

٢- الحلق (گەروو)

٣- اللسان (زمان)

٤- الشفتان (هەردوو لێو)

٥- الخیشوم (لای سەرەوە لوت)

یەك بە یەك باسیان ئەکەین

## یەکەم:الجوف

ئەم پیتانەی لێوەی دەر ئەچێ ٣ پیتن

ئەلیف , و , ي(مەدد)ی واتە پیتی پێش ئەلیفەکە فەتحەکە بێ پیتی پێش واوەکە زەممە بێ پیتی پێش یائەکە کەسرە بێ

## دووەم:الحلق

ئەم شەش پیتەی لێوە دەر ئەچێ

(ء،ه,ع,ح,غ,خ)

ئەکرێتە سێ بەش

ا- اقصی الحلق پیتەکانی (ء ، ه ) ئەگرێتەوە

٢- وسط الحلق پیتەکانی (ع , ح ) ئەگرێتەوە

٣- ادنی الحلق پیتەکانی ( غ , خ ) ئەگرێتەوە

# سێیەم: اللسان

## ئەو پیتانەی لە زمانەوە دەرئەچن (١٨) پیتن

## ئەوانیش پیتەکانی

## (ق,ك,ج,ش,ي مەددی)

## (نەبـێ ,ض،ل،ن،ر،ط،د،ت،س،ص،ز،ث،ذ،ظ

# چوارەم:الشفتان

### چوار پیت ئەگرێتەوە ئەوانیش پیتەکانی

### ( م,ب,و مەددی نەبێ,ف)

# پێنجەم:الخیشوم

**مەبەست لەمینگەیە پیتیەکانی (ن,م) ئەگرێتەوە بەلام مینگەی پیتی (م) زیاترە لە (ن)**



# بەشی دووەم

## صفات الحروف

### ئەوانیش دوو جۆرن

ئەو سیفەتانەی کە دژیان هەیە وە ئەو سیفەتانەی کە دژیان نیە

یەکەم
ئەو سیفەتانەی کە دژیان هەیە پێنجن
١-الهمس(چرپە)
ئەو پیتانە ئەگرێتەوە (ف,ح,ث،ه،ش،خ،ص،س،ك،ت)لەو دێرە کۆکراونەوە
(فَحَثَهُ شَخصُ سَكَت)
الهمس دژەکەی الجهر(دەنگ بەرزی)
ئەم پیتانە ئەگرێتەوە کە لە پیتەکانی الهمس نین

٢-الشدە(توندی)
ئەو پیتانە ئەگرێتەوە(ء،ج،د،ق،ط،ب،ك،ت) لەو دێرە کۆکراوەنەوە بۆ ئاسانکاری (ءَجِدُ قَط بَكَت)
الشدە دژەکەی الرخاوە(نەرمی) لەغەیری پیتەکانی الشدە ئەوانی تر ئەگرێتەوە

٣-استعلاء(بەرزی)
ئەو پیتانە ئەگرێتەوە (خ,ص،ض،غ،ط،ق،ظ)لەو دێرە کۆکراوەتەوە (خُصَ ضَغطٍ قِظ)
استعلاء دژەکەی الإستفال(نزمی) ئەو پیتانە ئەگرێتەوە کە لە پیتی استعلاء نین

٤-اطباق(لکاندن)
ئەو پیتانە ئەگرێتەوە (ص،ض،ط،ظ)
اطباق دژەکەی الانفتاح(دورکەوتنەوە)ئەو پیتانە ئەگرێتەوە کە پیتەکانی اطباق نین

٥-الإذلاق(خێراو ئاسان)
ئەو پیتانە ئەگرێتەوە (ل,ن,ر,ف,م,ب) کە لەو دێرە کۆکراوەتەوە (فَرَّ مِن لُب)
الإذلاق دژەکەی الإصمات(ڕێگرتن) ئەو پیتانە ئەگرێتەوە کە پیتی الاذلاق نین




**دووەم**

**ئەو سیفەتانەی کە دژیان نیە حەوتن**

**١-الصفير(فیکە)**

**ئەم پیتانە ئەگرێتەوە (ص،س،ز)**

**٢-القلقلە(لەرینەوە یان دەنگ دانەوە)**

ئەم پیتانە ئەگرێتەوە

**(ق ،ط،ب،ج،د)**

**کە شەددەیان لەسەر بوو ئەوا قەلقەلەی کوبران کە شەددەیان لەسەر نەبوو قەلقەلەی وسطان کە لەناو وشەدا بوون قەلقەلەی صوغران**

**٣-الين(نەرمی)ئەم پیتانە ئەگرێتەوە (و,ی)مەرجە پیتی پێش خۆیان فەتحەیان لەسەر بێ**

**٤-الانحراف(لادان)**

**ئەم پیتانە ئەگرێتەوە (ل,ر)**

**٥-التفشي(بلاوبونەوە)**

**ئەم پیتە ئەگرێتەوە(ش)**

**٦- التكرير(دووبارەبونەوە)**

**پیتە ئەگرێتەوە (ر)بەلام نابێ لەدوو جار زیاتر دووبارە بێتەوە زیاتر بێ هەلەیە**

**٧- الاستطالە(درێژبونەوە) ئەم پیتە ئەگرێتەوە (ض)**

**تێبینی:پیتەکان بە ساکینی سیفاتەکانیان جوان لێ دەرئەکەوێ**

# بەشی سێیەم

## احکامی النون الساکن و التنوین

چوار جۆرە :

١-اظهار (ئاشراکردنی نون)

٢-ادغام (تێکەڵکردن)

٣-اخفاء (شاردنەوە)

٤- اقلاب (هەڵگەرانەوە)

.....................................

## ا-اظهار :

پیتەکانی شەش ئەمانەن (ء, ه, ع, ح, غ, خ ).

هەرکاتێك تەنوینەکان تەنوینی فەتحە یان تەنوینی ضمە یان تەنوینی کەسرە یاخود نونێکی ساکن گەیشت بە پیتەکانی اظهار ئەوا نونی تەنوینەکە یان نونە ساکنەکە جوان دەردەخەین.

نمونە بۆ نونی ساکن :

(مِنْ خَوف)

نمونە بۆ تەنوین :

(سَمیعٌ عَليم)

أمثلة الإظهار الحقيقي

| حرف الإظهار | أمثلة النون الساكنة | | أمثلة التنوين |
|---|---|---|---|
| ء | ﴿وَيَنْـَٔوْنَ﴾ | ﴿ٱسْكُنْ أَنتَ﴾ | ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ |
| هـ | ﴿عَنْهَا﴾ | ﴿وَإِنْ هُمْ﴾ | ﴿جُرُفٍ هَارٍ﴾ |
| ع | ﴿أَنْعَمْتَ﴾ | ﴿مَنْ عَمِلَ﴾ | ﴿سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ﴾ |
| ح | ﴿يَنْحِتُونَ﴾ | ﴿لَّدُنْ حَكِيمٍ﴾ | ﴿عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ |
| غ | ﴿فَسَيُنْغِضُونَ﴾ | ﴿مِنْ غَيْرِ﴾ | ﴿وَرَبٌّ غَفُورٌ﴾ |
| خ | ﴿وَٱلْمُنْخَنِقَةُ﴾ | ﴿مِنْ خَشْيَةِ﴾ | ﴿يَوْمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ﴾ |

## ٢- ادغام

پیتەکانی شەشن ( ی, ر, م, ل, و, ن )کە لەو وشەدا کۆکراونەوە (یرملون).

هەرکاتێك تەنوینی فەتحە یان کەسرە یان ضمە یان نونی ساکن گەیشت بە پیتەکانی ادغام ئەوا تێکەڵکێشیان دەکەین.

نمونە:

مِن واق      دەڵێین: میوواق

صٰلحاً لَّنَكُونَنَّ      دەڵێین: صالیحەل لەنوکونەننە

| | الحرف | مع النون الساكنة | مع التنوين |
|---|---|---|---|
| إدغام بغنة | يـ | مَن يَقُول | بَرقٌ يجْعَلون |
| | ن | مِن نِعمَة | يومئذٍ نَاعِمة |
| | مـ | من مَال اللّه | لُؤلُؤاً منثُورا |
| | و | مِن وَالٍ | ولكُلٍّ وجْهَة |
| بغير غنة | لـ | مِن لدُنه | فسَلامٌ لك |
| | ر | من ربّهِم | غفُورٌ رحِيم |

*تێبینی لەمانەدا ادغام رونادات:
(الدنیا,عنوان,صنوان عنوان)

* ادغام لەڕوی مینگەوە دوو جۆرە:

١ـ ادغام بغنه ( به مینگه )

چوار پیت دەگرێتەوە « ي ، و ، ن ،م » یان « ینمو».

(ن,م) غوننەی تەواو وەر دەگرن پێیان دەوترێ (ادغام كامل بغنه)
پیتەكانی (و,ي) كەمێك مینگە وەردەگرن پێیان دەوترێ (ادغام ناقص بغنه)

## ٢ـ ادغام بلاغنه ( بەبێ مینگە)

پیتەكانی « ل, ر » دەگرێتەوە و هیچ مینگەیەكیان نیە و پێیان دەوترێ ( ادغام كامل بلا غنه).




## جۆرەكانی ادغام

یەكەم/ ادغام المتماثلين:

دوو پیتی وەك یەك ئەگەن بەیەك (م_م) یان پیتەكانی تر كە سیفات و مەخرەجیان وەك یەكە مەرجە پیتی یەكەم ساكن بێ و پیتی دووەم موتەحەرریك بێ واتە پیتی دووەم فەتحە و كەسرەو زەممەی پێوە بێ شوازی خوێندنەوەی پیتی یەكەم

ناخوێنینەوە ڕاستەوخۆ پیتی دووەم بە شەددە داری ئەخوێنینەوە.
نم/ لَهُم مَّایشاءون ، مَن نَّشاء

دووەم/ ادغام المتجانسين:

دوو پیت بە یەك ئەگەن یەکەم ساکن بێ ئەوەی تریان جوڵە دار بێ کە هەردوو پیت لە یەك مەخرەج دەردەچێ بەڵام سیفەتیان جیاوازە پیتی یەکەم یەکەم تێکەڵکێش ئەکرێ لەگەل پیتی دووەم پیتی دووەم شەددە وەردەگرێ.

ئەکرێتە سێ کۆمەڵەوە:

١- (ت , د , ط )
نم/ <u>ودتْ طَّائفة</u> یان <u>احطْتُّ</u> یان <u>قدْ تَّبين</u>

*بەڵام ئەگەر ط لە پێش پیتی ت بوو ئەوا ط تەواو بزرنابێ چونکە سیفەتی قەڵەویەکەی دەمێنێ.

٢- ( ث ، ذ ، ظ )
نم/ <u>يلهثْ ذّالك</u> یان <u>إذْ ظَّلموا</u>

٣- ( ب , م ) یاسایەکە سابتە یەعنی دەبێ ( ب )یەکە بێ ئینجا ( م) بێ گەرنا دەبێتە اخفاءالشفوي.
نم/ اركبْ مَّعنا     سورەتی الهود

سێیەم/ ادغام المتقاربين:

تێك هەڵكێشانی لێك نزيك واتە سيفەت و مەخرەجيان لێك نزيكە.

بريتيە لە بەيەك گەيشتنی
( ل,ر ) و ( ق , ك)
مەرجە پيتی يەكەم ساكن بێ و پيتی دووەم موتەحەريك بێ ئەوكات پيتی دووەم شەددە وەردەگرێ.

- نمونە بۆ كۆمەڵەی يەكەم ( ل , ر )
قلْ رَّب   يان   بلْ رَّفعنا

- نمونە بۆ كۆمەڵەی دووەم ( ق , ك )
كە تەنها يەك وشە هەيە لە قورئان لە سورەتی المرسلات.
الم نخلقْكُّم

* له ریوایەتی تر هەیە کە ئەتوانی قافەکە بخوێنیەوە و
کافەکەش بە سادەیی بخوێنیەوە
بەڵام لە ریوایەتی حفص عن العاصم ادغامەکە بە تەواوی
دەخوێندرێتەوە یەعنی بەبێ قەڵقەڵەی قافەکە وا باشترە وا
بیخوێنیەوە.

# اتقاءالساكن

## بەیەك گەیشتنی دوو ساكن

هەر كاتێك تەنوین گەیشت بە هەمزەی وصل وە دوای هەمزەی وصلەكە پیتێكی ساكن بوو ئەوا ئەبێتە اتقاءالساكن

نم/ جزاءًالحسنىٰ

چۆن ئەیخوێنینەوە




حەرەكەیەك لە تەنوینەكە + نونێكی كەسرەدار نِ + پیتەساكینەكە

جزاءًالحسنىٰ

ئەڵێین جەزائەنیلحوسنا

اللام الشمسية
واللام القمرية وأمثلة عنها من القرآن الكريم




اَلْقَمَرِيَّة

لام نكتبها وننطقها




اَلشَّمْسِيَّة

لام نكتبها ولا ننطق

## بەشی چوارەم

ل ( الشمسی و القمری )

لامی شەمسی و قەمەری

لامی شەمسی هەرکاتێک

لەدوای ال شەددە ( ّ ) هات ئەوا ئەبێتە لامی شەمسی

نمونە النَّجم / الشَّمس / السَّماء

لامی شەمسی ئەگەر لەسەرتا ئایەت هات تەنها ئەلیفەکە ئەخوێندرێتەوە

نمونە

النَّار / ئەننار لامەکە ناخوێندرێتەوە

بەڵام ئەگەر لەناو ئایەت هات نە ئەلیف نە لام ناخوێندرێنەوە

نمونە / والنَّهار

## لامی قەمەری

هەرکاتێك لەدوای ال شەددە نەهات پێی ئەوترێ لامی قەمەری
نمونە الحاقە لەدوای ال شەددە نەهاتووە لامی قەمەریە

له لامی قەمەریدا

ال لەسەرەتای ئایەت هات ئەلیف و لامەکە ئەخوێندرێتەوە
نمونە / الحاقە

بەلام کە لەناو ئایەت ال هات
ئەوا تەنها لامەکە ئەخوێندرێتەوە
نمونە / من الحق

## تێبینی

لامی وشەکانی

السنتکم یان والوانکم

نابێتە لامی قەمەری چونکە لامەکە هی خودی وشەکەن

دووەم تێبینی
ئەو لامانەی ئەچێتە سەر فعل نابێتە لامی شەمسی و قەمەری

نمونە وەک

التقی / الهاکم / التقتا

سێیەم تێبینی

اسم الموصول نابنە لامی شەمسی و قەمەری

نمونە وەک

الذي / التي / / الذين / اللذان

## ل ( لفظ الجلالة ) لامی ناوی خوا




لەچوار حاڵەتدا بەباریکی ئەخوێندرێتەوە
ئەوەی تر هەموو بە قەڵەوی ئەخوێندرێتەوە

یەکەم

ئەگەر پیتی الله پێشی کەسرە بوو
( بسم الله الرحمن الرحيم )

دووەم

ئەگەر پێتی پێش الله ساکن بێ و پیتی پێش ساکینەکە کەسرەبوو ( وینجی الله_ في الله )

سێیەم

ئەگەر پیتی پێش الله تەنوین بوو ( اتقاء الساكن )
قوماً الله قەومە نیل لاهو یەنی نونی تەنوینەکە کەسرە وەر ئەگرێ

چوارەم

ئەگەر هاتوو خودە لامی الله کەسرە بوو

الحمدللهِ

## بەشی پێنجەم
## احكامی ڕاء (ر)

### لەچوار حالەتدا بەباریکی ئەخوێندرێتەوە

١- ئەگەر پیتی (ر) کەسرەی لەژێر بوو نمونە/فَأَسرِ

٢- ئەگەر پیتی (ر) ساکن بوو بەڵام پیتی پێش (ر) کەسرەی لەژێر بوو نمونە/ منذِر

٣- ئەگەر پیتی (ر) ساکن بوو وە پیتی پێش (ر) ساکن بوو ئەچینە پیتی سێیەم کە کەسرەبوو بەباریکی ئەیخوێنینەوە نمونە / سِحر

٤- ئەگەر پیتی (ر) ساکن بوو بەڵام لە پێش خۆی یائێکی ساکن هاتبوو (ي) ئەوا ڕاستەخۆ بە بەباریکی ئەیخوێنینەوە نمونە / خَیر




## وە پیتی راء بە گەورەیی ئەخوێندرێتەوە لەم حالەتانەدا

١- ئەگەر خودی پیتی (ر) فەتحە یان زەمەی لەسەر بوو نمونە/ رُزقنا یان سِرَاجا

٢-ئەگەر پیتی (ر) سکون بوو بەڵام پیتی پێش خۆی فەتحە یان زەمەی لەسەربوو نمونە/ غُرفە یان یَرجون
٣- ئەگەر پیتی (ر) ساكن بوو بەڵام پیتی پێش خۆی كەسرەی نا طبيعي هەبوو زۆربەی كات هەمزەی وەسڵ لە پێش رائەکەیە نمونە / أَمِ اُرتابو یان لمَنِ اُرتضی یان اِرُجع
٤-ئەگەر پیتی (ر) ساکن بێ وە پیتی پێش خۆی کەسرەیەکی ئەسڵی هەبێ بەڵام پیتی دوای (ر) یەكێك بێ لە پیتەکانی استعلاء ئەوا (ر) بە قەڵەوەی ئەخوێنینەوە
نمونە / لباُلمِرصاد یان قِرطاس یان فِرقە
٥- ئەگەر پیتی (ر) کەسرەی لەژێربوو بەڵام لەسەری وەستاین و پیتی پێش خۆی ساکن بوو وە پیتی سێیەم فەتحە یان زەمە بوو نمونە/ القَدرِ لەکاتی وەستان بە رِ ئەخوێندرێتەوە

ئەوانی تر بە کەیفی خۆتە بە قەڵەوی یان بەباریکی ئەیخوێنیەوە

## بەشی شەشەم




## مەد

پیتەکانی مەد سێ پیتن
ئەلیف و واو و یاء

جۆرەکانی مەد چوار جۆرن ( مەدی ئەسلی , مەدی فەرعی , مەدی عارض السکون , مەدی الین )

یەکەم مەدی ئەسلی

ئەبێتە سێ جۆر

مەدی طەبیعی
ئەلیف و واو یا دەگرێتەوە بە تەبیعی وەکو نوحیها
هەمزە و سکونی لەدوا نایە
دوو حەرەکە درێژی ئەکەیەنەوە

## دووەم مەدی عوض

ئەو مەدەیە کە کۆتایی بە تەنوین فەتحە هاتووە دوو حەرەکە درێژی ئەکەینەوە ئەبێتە ئەلیفی دوو حەرەکە نم/ سماءً بەلام تەنوینەکە لەسەر پیتی ة بێ نابێتە مەد وەکو شجرةً ئەڵێی شەجەرە ناڵێی شەجەرا

## سێیەم مەدی الصلة الصغری

هەرکاتێك پیتی ( ه ) لەناو وشەدا کەسرە لەسەر بوو یان ضەمە وە پیتی پێش و پاشی هائەکە ئەبێ حەرەکەی هەبێ

بِهِۦ يُؤۡمِن

بەلام لە ئایەتی ویخلد فیه مهانا لە سورەتی فورقان پیتی پێش هائەکە حەرەکەی نیە ساکنە بەلام هەر بەدوو حەرەکە هائەکە ئەخوێنینەوە

وە لە ئایەتی یرضَهُ لَکم پێش و پاشی هائەکە حەرەکەی هەیە بەلام هائەکە بە دوو حەرەکە درێژی ناکەینەوە بەس یەك حەرەکەیە

## مەدی البدل

دوو هەمزە بەدوای یەکدا دێن هەمزەی دووەم ساکنە ناخوێندرێتەوە

هەمزەکە ئەگۆڕێرێ بۆ بۆ دوو حەرەکە

دوو حەرەکە درێژ ئەکرێتەوە

نم أَأْدم > ءادم / لإءلاف > لإِيلَٰف

أُؤْتو >أُوتو

## مەدی ئاسایی جێگیر لەکاتی وەستاندا

ئەو مەدەیە کە لەکاتێکدا ئەوەستین دوو حەرکەیە بەڵام کە بەدوایدا پیتێکی ساکن دێ ئەبێتە یەك حەرکە واتە بەس لەکاتی وەستاندا دەرکەوێ

نم/ لصالوالجحيم  يان ذي الأوتاد

يان كانتا اثنتين

## دووەم جۆری مەد

## مەدی فەرعی

ئەو مەدەدەیە بەهۆی هەمزە و سکونەوە دروست ئەبێ

ئەو مەدەدەی بە هۆی هەمزەوە دروست ئەبێ ئەبێتەوە سێ جۆر



یەکەم

## مەددی متصل

لەیەك وشەدا روئەدا واتە مەد و هەمزەکە لە یەك وشەدان
چوار یان پێنج حەرەکە درێژی ئەکەینەوە
نم/ یَشاۤءون

## دووەم

## مەددی منفصل

لە دوو وشەی جیاواز مەددەکە لە وشەیەکە هەمزەکە لە وشەی دوای خۆی
دوو یان چوار یان شەش حەرەکە درێژی ئەکەینەوە
تم/إلىٓ أَهلِها

## سێیەم

## مەددەی الصلة الکبری

لەدووای هایٔ ( ه ) هەمزە دێ پێنج حەرەکە درێژی ئەکەینەوە نمونە

مالَهُٓ أخلده




## دووەم جۆری مەدی فەرعی

کە بەهۆی ساکینەوە دروست ئەبێ

ئەویش پێی ئەڵێن

مەدی لازم

مەدی لازم دوو جۆرە

یەکەم

## مەدی لازمی کەلیمی

دوای مەد شەددە بێ یان ساکن

دوای مەدەکە شەددە هات قورسە

دوای مەدەکە ساکن هات ئاسانە

بۆ ساکن بەس یەك وشەمان هەیەآلءان سورەتی یونس

والضَّآلِّين

دووەم

مەدی لازمی حەرفی

ئەو پیتانەی لەسەرەتای سورەتەکان هاتوون و مەددەیان

لەسەرە دوو جۆرن

یەکەم

پیتەکانی

ن , ق , ص , ع , س ، ل , ك , م

نقص عسلكم

نم/ قٓ

لەسەرەتای قورئان دێن شەش حەرەکە درێژیان ئەکەینەوە

دووەم

ح ، ي ، ط ،ه ، ر

حي طهر

نم/ حم حائەکە دوو حەرەکە میمەکە شەش

دوو حەرەکە درێژ دەکرێنەوە

## سێیەم جۆری مەد

## مەدی العارض السكون

لەسەر وشەیەك وەستای یان كۆتایی ئایەت پیتی پێش پیتە كۆتاییەكە ئەبێ ئەلیف و واو و یای مەدی بێ دوو یان چوار یان شەش حەرەكە درێژی ئەكەیەوە

نمونە مسلمِین

## چوارەم جۆری مەد

### مەدی الین

( و , ی )

پیتی پێش پیتی کۆتایی ئایەت ئەمانە بن

( و، ي )

مەرجە لەکۆتایی ئایەت بێن یان لە وشەیەك وستاین

دوو چوار شەش حەرەکە درێژی ئەکەیەوە مەرجە پیتی پێشیان کەسرە بێ

نمونە/ خَوف

تێبینی١:مەدی لین بەوە جیادەکرێتەوە لەمەدی عارض لسکون

کە پیتی پێش

و , ی فەتحەی لەسەرە

تێبینی٢: هەرکاتێك بەسەر مەدی عارض لسکون دا رۆیشتن

ئەبێتە مەدی طبیعي

# بەشی حەوتەم

## هەمزەی وەسل

هەمزەی گەیاندن

هەمزەیەکە سەڵکە سادێکی لەسەرە ( اُ )

ئەو هەمزەییە کە تەنها لەسەرەتا و دەست پێکێردنی وشە لەکاتی ڕۆیشتن واتە تێکەڵکردن ناخوێندرێتەوە

ئایە هەمزەی وەسڵ لەسەرەتا هات چۆن ئەخوێندرێتەوە

هەمزەی وەسڵ ئەچێتە سەر سێ شت

ئەچێتە سەر

یەکەم / فعل

دووەم / اسم

سێیەم / حرف

یەکەم  ئەگەر هەمزەی وەسڵ چوو بۆ سەر فعل پیتی سێیەمی وشەکە زەمە بوو هەمزەی وەسلەکە بە زەمە ئەخوێندرێتەوە

نمونە

اُرکُض  / اُدعُ / اُجتُثت

بەڵام ئەگەر پیتی سێیەم کەسرە بوو یان فەتحە بوو ئەوا هەمزەی وەسلەکە بە کەسرە ئەخوێندرێتەوە

نمونە

اصبِر / استَغفر

دووەم ئەگەر هەمزەی وەسڵ چوە سەر اسم

هەموو کات هەمزەی وەسل لە اسم بە کەسرە ئەخوێندرێتەوە

نمونە

إسمُه / إمره / إبنُ

سێیەم ئەگەر هەمزەی وەسڵ چووە سەر حرف
بەردەوام هەمزەی وەسلەکە بە فەتحە ئەخوێندرێتەوە  واتە لەگەل
پیتی (ل) کۆئەبێتەوە

نمونە الجبال

تێبینی ئەم وشانە یاسایان لەسەر جێبەجێ نابێ

ابنو / ئیبنو

امشوا / ئیمشو

ائتوا / ئیتو

اقضوا / ئیقضوا

ائتوني / ئیتونی

# بەشی هەشتەم

## استعاذە

واتە أعوذ باللە من الشیطان الرجیم
هەموو حاڵەتاکان دروستە

## بسملە

واتە بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لەیەك حاڵەتدا
بەهیچ جۆرێك جائیز نیە
کۆتای سورەت لەگەڵ بسم اللە لێکبدەی و رابوەستی ئینجا
سەرەتای سورەت بخوێنی
جائیز نیە بەهیچ شێوەیەك
تێبینی لە سورەتی التوبە بسم اللە تیا نیە
یان ئەبێ کۆتای سورەتی الانفال و سەرەتای سورەتی التوبە لێك بدەی
یانیش ئەبێ کۆتایی الانفال بخوێنی و رابوەستی
ئینجا سەرەتای سورەتی التوبە بخوێنی
ئەو دوو شێوازە دروستە

س

سکتە ئەگەر لەسەر کۆتایی وشەیەك هات ئەبێ رابوەستی وە هەناسە وەرنەگری و نەیدەیەوە ئینجا دەست بەخوێندنەوە بکەی

بەلام ئەگەر لەسەر پیت هات ئەوا باشتر وایە بە سین بیخوێنیەوە
ئەگەریش لە ژێر پیت هات ئەوا باشتر وایە بە پیتەکەی سەر خۆی بخوێنیەوە

# إماله

له یەك شوێن هەمانه له قورئان له سورەتی هود

لەو وشەی  مجراها کە ئەبێ بلێ مەجرێها






## إشمام

له یەك شوێن هەمانە لە قورئان لە سورەتی یوسف
لە وشەی تأمنَّا کە لە ئەسڵدا تأمنُنا بووە
کە ئەگەی بە نونەکە لێوت وەك پیتی واو لێ ئەکەی
بەڵام دەری نابری





## تسهيل همزه

له یەك شوێن هەمانە له سورەتی فصلت

له وشەی أَاْعْجَمِيٌّ

هەمزەی یەكەم بە فەتحە ئەخوێنینەوە هەمزەی دووەم

بە ئا ئەڵێن ئەئاعجەمیو

# علامات القرءان

| العلامة | الدلالة |
| --- | --- |
| م | علامة الوقف اللازم |
| ∴ ∴ | تفيد جواز الوقف بأحد الموضعين وليس في كليهما |
| لا | تفيد النهي عن الوقف |
| م | للدلالة على وجود الإقلاب |
| صلى | تفيد بأن الوصل أولى مع جواز الوقف |
| ا | للدلالة على النطق بالحروف المتروكة |
| قلى | تفيد بأن الوقف أولى مع جواز الوصل |
| س | للدلالة على النطق بالسين بدل الصاد، وإذا وضعت بالأسفل فالنطق بالصاد أشهر |
| ج | تفيد جواز الوقف |
| ~ | للدلالة على لزوم المد |
| ۩ | للدلالة على موضع السجود، أما الكلمة التي يسجد بعد قراءتها فقد وضع عندها خط. |
| ۞ | للدلالة على بداية الأجزاء والأحزاب وأنصافها وأرباعها |